پارێزگای سلێمانی






محافظة السليمانية

Slemani Governorate

# هەڵەبجە و سەمای نۆتەکان

نوسين و بە نۆتەکردنی :

ئازاد ساڵح

٢٠٢٤

**به پشتیوانی بەرێز د. هەڤاڵ ئەبوبەکر پارێزگاری سلێمانی ، چاپ کراوه**

**ناوی کتێب :** هەڵەبجە و سەمای نۆتەکان

**بابەت** : موزیک

**نوسین و ئامادەکردنی :** ئازاد ساڵح – شنروێ

**پێداچونەوەو هەڵەبڕی :** مەریوان سەلاح حیلمی

**دیزاینی ناوەرۆک :** جوانە سۆفی

**وێنەکێشانی بەرگ :** ڕزگار محەمەد - شاڵی

**دیزاینی بەرگ** : نزار نوری

**تیراژ:** ١٥٠ دانە

**نرخ** : ١٠٠٠٠، دە هەزار دینارە

**چاپخانە** : چاپخانەی پاندا – سلێمانی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (          ) ساڵی ٢٠٢٤ ی

پیدراوە

## پێشکەشە

بەو هەموو ئەندامە موزیک ژەنانە .گۆرانی بێژانە .کۆرسانە ، کە لەماوەی  پەنجا سالّدا واتە نیو سەدە کە بە دەیان هونەرمەندن , هەر لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی تیپەکەوە ،لەو مێژووە دوورو درێژەوە تا ئێستا بەشدار بوون لەو هەموو چالاکیە جۆراو جۆرانەی تیپەکەدا کە ئەنجامی داوە و ئێستا ئەو بەرهەمانە لە بۆتەی ئەم کتێبەدا خۆیان دەبیننەوە کە گەنجینەیەکی هونەری موزیکە بۆ نەوەکانی دوای خۆمان دەمێنێتەوە ....

## پێشەکی

**نوسینی : مەریوان سەلاح حیلمی**

**(١)**

کتێبی { **هەڵەبجەو سەمای نۆتەکان** } کتێبی سێیەمی کاک ئازاد ساڵحە لەبواری خزمەتکردن بە هونەرو گۆرانی کوردی بەگشتی و هونەری دەڤەری هەڵەبجە بە تایبەتی، ئەم کتێبە هەم کتێبێکی ئەرشیفییە، هەم کتێبی زانستی بواری نۆتەو مۆسیقایە، ئەرشیفییەکەی بەو مانایە دێت کە مێژووی مۆزیکی هەڵەبجە بەتایبەتی **{تیپی مۆسیقای شنروێ}** لە ساتی دروستبوونییەوە هەتا دوا بەرهەمی، شیعرو نۆتەکانی نوسیووەتەوە، وەهەم کتێبێکی زانستیشە کە هونەرمەندانی ئێستا دەتوانن سوود لەو نۆتانە وەربگرن کە کاک ئازاد ڕەنج و ماندووبوونی لە پێناویدا چەشتووە بۆ ئەوەی نەوەی تازە سوودی لێوەربگرن و نەوەی دێرینیش ئاگاداری ئەوە بن کە لەڕابردوودا کاک ئازاد و تیپی شنروێی هەڵەبجە چ کارێکیان کردووە.

**(٢)**

ئەڵبەتە لەسەرەتای دروستبوونی هەموو تیپێک، یان هاتنە پێشەوەی هەر گۆرانی بێژێک، یان مۆسیقا ژەنێک، پێویستی بەوەیە کە پرۆڤە لەسەر بەرهەمی هونەرمەندە نەمرەکانی رابردووبکاتەوە، بۆ ئەوەی ڕابێت لەسەر ئەوەی کە بتوانێ لەداهاتوودا کاری نوێ و بەرهەمی تازە بدات بە گوێگروبینەرەکانی، دیارە کاک ئازاد و هاوڕێکانی لە تیپی مۆسیقای شنروێ بەم ڕێگایەدا ڕۆیشتوون، ئەمەش بوو بە بناغەیەکی پتەو بۆ ئەوەی هەم تیپەکەو هەم هونەرمەند گۆرانی بێژو مۆسیقا ژەنەکان ڕەگ دابکوتن و لەقۆناغێکی دواتردا بتوانن ڕەسەنایەتی ناوچەی هەڵەبجەو شارەزوورو هەورامان بپارێزن و لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگ بداتەوە، بۆیە لە خۆڕا نییە کە هەر کاتێک گوێت لەگۆرانییەکی کۆن یان تازەی تیپی مۆسیقای شنروێ دەبێت یەکسەر دەتباتەوە و گەشتت پێ دەکات بۆ ناوچەکانی سنووری هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوور و ڕەسەنایەتی ئەو ناوچانەت پێ ئاشنا دەکات، ئەم کارەش پێی دەوترێ شەقڵ و مۆرکی ڕەسەنایەتی ناوچەیەک.

**(٣)**

بەپشت بەستن بەکارو بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای شنرویّ و ئەم کتێبە تازەیەی کاک ئازاد دەتوانین کارو بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای شنرویّ دابەش بکەین بۆ دوو قۆناغی جیاواز:

**قۆناغی یەکەم** : لەساتی دروستبوونییەوە لە ساڵی ١٩٧٣ تاوەکو ساڵی ١٩٨٨ ئەم قۆناغە هەم قۆناغێکی گرنگ و ڕەگ داکوتانە، هەم قۆناغی بەردەوامی و خۆدۆزینەوەیە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە حەزی هونەرمەندانی شاری هەڵەبجە بەگشتی و کاک ئازاد ساڵح بەتایبەتی، حەزو خولیاو خەونێکی هەرزەکاری نەبووە بۆ قۆناغێکی دیاریکراو و لەگەڵ تێپەڕینی قۆناغ و تەمەنەکە ئیتر ئەمانیش ساردببنەوە و کۆتایی بەکارەکانیان بهێنن، هەرچەندە وەکو لە پێشەکی کتێبی **{هەڵەبجەو مۆزیک و بیرەوەری و یاد}** ی کاک ئازاد دا ئاماژەمان بۆ ئەوە کردووە لەدوای ساڵێک لەدامەزراندنی تیپی مۆسیقای شنرویّ، کورد و شۆڕشەکەی لە ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٥ تووشی نسکۆ و شکست دەبن و هەڵەبجە بۆمباران دەکرێت و خەڵکەکەی ئاوارەی ئێران و بەشێک لە شارەکانی کوردستانی عێراق دەبن، هەر دوای ئەمەش وەکو کاک عومەری حاجی عینایەت لەڕۆمانی **{من و شارەکەم}** دا زۆر جوان ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە هەڵەبجە وەکو یاری مۆندیالی لێهاتبوو، هەر چوارساڵ، یان چەند ساڵ جارێک تووشی کارەسات و ماڵوێرانی و ئاوارەیی دەبۆوە.

بۆیە لە هەشتاکانیشدا بەهۆی شەڕی ئێران - عێراق کە هەشت ساڵی خایاند، هەڵەبجە ڕۆژانە تۆپباران ئەکرا و ژیانی خەڵکەکەی هەمیشە لە مەترسیدا بووەو چەندین شەهید و بریندار، بوونە قوربانی ئەو قۆناغە سەختە، بەڵام تیپی مۆسیقای شنرویّ و کاک ئازادیش لەو کاتەدا وەکو سەرۆکی تیپەکە، کەوتە بەرپرسیاریەتییەکی واوە، کە خەڵکی ناوچەکەو کوردستان بەتەواوی کاک ئازادیان بەستەوە بە چاوەڕوانییەکی وەهاوە کە بتوانیّ ئەم تیپەو بەرهەمە هونەرییەکانی گەشە پێبدات، هاوکاتیش سەرنج و بەرچاوی بۆ کاری ڕۆژانەو داهاتوو ڕوونتر بێت.

بەکورتی ئەم قۆناغە هەم قۆناغی بناغەو ڕەگ داکوتان بوو، هەم قۆناغی پەرەسەندن و دۆزینەوەی شەقڵ و مۆرکی ناوچەکە بوو کە ڕەنگدانەوەی تەواوی لەکاری هونەرییاندا هەبوو.

**قۆناغی دووەم :** لە ساڵی ١٩٨٨وە دەست پێدەکات تاوەکو ئەمڕۆ. لەدوای ئەم قۆناغە ئەرکی کاک ئازاد و تیپی مۆسیقای شنرویَ قورستربوو چونکە جگە لەوەی کە ئەم تیپە خەونی رەنگاڵەیی پێشکەوتنی هەبوو، هاوکاتیش چەندین هۆکار بووە هۆی ئەوەی کە تواناکانی ئەم تیپە دابەش بێت: ١ـ دەبوو لە دوای ساڵی ١٩٩١وە ئەرکی سەرەکی و هەوڵی سەرەکی و بەرهەمی سەرەکی بۆ یادی ١٦.٣ـ ١٩٨٨ ی کیمیابارانی هەڵەبجە تەرخان بکرێت، لەکاتێکدا جگە لەوەی کە ئەمە ئەرکێکی گرنگ و پیرۆز بوو، هاوکاتیش ئەم توناناو وزەیە خەرج کرا لەسەر حسابی بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی تر، چونکە بمانەویَ نەمانەویَ کۆڕاڵ و ڤیستیڤاڵ و یادە غەمگینەکانی گەلەکەمان لەناویاندا کارەساتی هەڵەبجە، لە ساڵێکدا یەک دوو ڕۆژێک ئەدریَ بە گوێچکەی بینەرو گوێگردا، ئەمەش زەربەیەکی توند لەکارەکان و وزەکانی توانای ئەم تیپەو ئەم هونەرمەندانە دەدات و داویەتی. ٢ـ بارودۆخی خراپی ئابووری دوای ساڵی ١٩٩١و چوونی بەشێک لە ئەندامەکانی ئەم تیپە بۆ دەرەوەی وڵات و یان ئەوانەی ناو وڵات بە گرانییەکی بێلەزەتەوە خەریک بوون بە بژێوی ژیانەوە،کە کاری لە تیپی مۆسیقای شنرویَ کرد.

لەگەڵ ئەم هۆکارانەشدا لەم قۆناغەدا بووە هەوێنی دروستبوونی چەندین بەرهەمی جوان کە نۆتەکانیان و شیعرەکانیان لەم کتێبەدا رەنگی داوەتەوە.

**(٤)**

لەم بەشەدا نابیَ ئەوەش لەبیر بکەین کە تیپی مۆسیقای شنرویَ لەسەرەتادا مۆڵەتی کارکردنیان نەبووە، بەکورتی وەکو تیپێکی قاچاخ یان نیمچە قاچاخ کاریان کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەم تیپەکە و هەم تیپی مۆسیقای منالانی مامڵێ کە سەر بەتیپی مۆسیقای شنرویَ بوو، کاک ئازاد دایمەزراندبوو، ساڵانە لە ڤیستیڤاڵی شارەکاندا ١٩٧٣ـ ١٩٩٨ هەمیشە لەکارە هونەرییەکانی مۆسیقاو شانۆییدا لە پێشەوە بوون و خەڵاتی جۆراوجۆریان وەرگرتووەو کارو بەرهەمەکانیان بۆ خۆیان بوونەتە ئەمری واقیع و خۆیان سەپاندووە، نەک خوانەخواستە بەدەست لەپشتدان بەرەو پێشەوە ڕۆشتبن، هۆکەشی بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە ئەو سەردەمانە هونەر وەکو چەکی خەبات و تێکۆشان سەیر دەکراو دەبوو هەر تاکێک لەم کۆمەڵگایە بە پێی ئەو ئاست و توانایەی کە هەیەتی خزمەتی کوردستانی بکردایە، واتە لەم کارەیاندا بەرژەوەندی تایبەتی نەبووە و ئەوەی کە گرنگ بووە بەرژەوەندی باڵای کوردستان لە پێشی هەموو شتێکەوە بووە، بەڵام کاتێک قۆناغی دوای ڕاپەڕین و دروستبوونی حکومەتی

هەرێمی كوردستان دێتە ئاراوە لەدوای ساڵی ١٩٩٢وە بارودۆخەكە لەرووی ئابوورییەوە ئەوەندە سەخت بوو، هاوكاتیش شەڕی ناوخۆی كوردستان دەرفەتی ئەوەی نەدا ئەو توانا گەورەیەی لە ناو هونەری هەڵەبجەییەكان هەبوو گەشە بكات، چونكە لەو سەردەمەدا چەقی قورسایی شەڕەكان كەوتبووە ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجەوە و هەڵەبجە بۆ خۆی بوو بوو بەزۆنێك كە دەسەڵاتی ئیسلامییەكانی تیادا باڵادەست بوو، كە لای ئەوان هونەر و چالاكییەكانی تیپی شنرویێ نەك هەر وەكو جۆرێك لە قەدەغە وابوو، بەڵكو سەرزەمینی شارەكەشیان لێ حەرام كرابوو، لەقۆناغێكی دواتردا كە بەعس دەڕوخێنرێت لە ساڵی ٢٠٠٣دا خەڵكی كوردستان بەگشتی و هەڵەبجەییەكان بەتایبەتی چاوەڕوانی ئەوە بوون كە ئیتر ئاهێك بە بەر شارەكەیاندا بێتەوەو شارەكە بەرەو ئاوەدانی بڕوات و هونەریش بچێتەوە سەر ڕێچكەی ئاسایی خۆیی و بگەڕێتەوە بۆ قۆناغی زێرین كە لە حەفتاكان و هەشتاكاندا گەیشتبووە ئاستێكی زۆر باش، بەڵام بەهۆی بێسەرەوبەرەیی دەسەڵاتی كوردی و كەوتنە هەڵڕشتنی پارە بۆ دامەزراندنی خەڵكی بە بێ بەرنامەو پارە هەڵڕشتن بۆ هونەرمەندانی دەرەوەی وڵات و دروستكردنی كلیپی جۆراو جۆر بۆیان، بەكورتی كوردستان تووشی نەزیفێكی گەورەی ئابووری بوو، ئەمەش لەقۆناغی قەیران و فرۆشتنی نەوت و ئابووری سەربەخۆ بەتەواوی ڕەنگی دایەوەو هەتا ئێستاش ئەو نەزیفە لەبەری دەڕوات و نەوەستاوەتەوە، هەر لە قۆناغی سەرەتای قەیرانی ئابووری ساڵی ٢٠١٤دا هونەرمەندانی دەرەوەی وڵات كە زانییان پارە هەڵڕشتن لەكوردستان نەما و نەك هەر ئەمەش ژیانی خەڵكەكەش كەوتە مەترسی و هەژارییەكەی ناخۆشەوە، ئیتر تێیان تەقاند و ئەو ڕۆشتنەی ڕۆشتنەوە، هەندێكیان هەر نەگەڕانەوەو ئەوانەشی كە تاك و تەرا دەگەڕانەوە بەهۆی دەعوەت و بانگهێشتەوە بوو، یان لەسەر حسابی خودی خۆیان بوو، مەبەستم لە هونەرمەندانی دەرەوەی وڵات ئەوە نییە دژیان بم، نەخێر، مەبەستم بێ بەرنامەیی حكومەتی هەرێم بوو كە نەیتوانی تیپە ناوخۆییەكانی كوردستان و لەناویشیاندا تیپی مۆسیقای شنرویێ بخاتە سەر سكەو سەرچاوەی ئابوورییان بەجۆرێك پتەو بكات كە هەرگیز لەكاری هونەری دوانەكەون و بەردەوام داهێنانیان هەبێت، بەڵام وەك كورد دەڵێ نەتۆز لە قوڕ هەڵدەستێت و نە پیاوەتیش لە نامەرد.

(٥)

وەک دەزانین کە شیعر ڕەگەزێکی گرنگی گۆرانییە لە هەموو جیهاندا، ئەوەی پەیوەندی بەم کتێبەو بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای شنرویەوە هەبێت دوو جۆرە: یەکەم: شیعری فۆلکلۆری کە جاری وا هەیە ئاوازەکەشی لەگەڵدایە، دووەم: شیعری نوسراوی کوردی چ ئەوانەی کلاسیکن یان شیعری تازەی سەردەمن، بێگومان سردوویش بابەتێکی سەربەخۆیەو لەم کتێبەدا ئاماژە بۆ هەندێ سروود و نۆتەکانیان کراوە.

ئەوەی پەیوەندی بە شیعری فۆلکلۆرییەوە هەبێت ئەمەشیان دوو جۆرە یەکەمیان ئەو شیعرە فۆلکۆرییانەن کە بە هەموو کوردستاندا بڵاوبوونەتەوەوەو هەر هونەرمەندێک ئەگەر بە وتنەوە بێت یان گۆڕانکاری لە ئاوازدا بێت وتوویانەتەوە، پاراستنی بەرهەمی فۆلکلۆری بە شیعرو ئاوازەوە دەگەڕێتەوە بۆ هونەرمەندە نەمرەکان کە لە ڕابردوودا بووبوونە پاراستن و خەزێنەیەکی باشی فۆلکلۆری کوردی و ئەگەر ئەوان نەبوونایە ئەوا زۆرێک لەم بەرهەمانە دەفەوتان، وەک نمونەیەک: حەسەن زیرەک بەسەرقافڵەو پاراستنی تێکست و ئاوازی فۆلکلۆری کوردی دادەنرێ، بەکورتی تیپی مۆسیقای شنروێ سوودیان لەبەرهەمی فۆلکلۆری هونەرمەندە نەمرەکانی ڕابردوو وەرگرتووە و وەک بناغەیەک بۆ گەشەسەندن و بەرەو پێشەوە چوونی تیپەکە، چونکە ئەگەر بناغە نەبێت ئەوا ناتوانی ئایندە بنیات بنێیت. کاتێک کە مۆسیقا ژەنێک پرۆڤە دەکات خۆ یەکسەر بە ئاوازی تازە دەست پێناکات، بۆ گۆرانی بێژیش بەهەمان شێوە، بۆیە فۆلکلۆر بۆتە بناغە بۆ تیپی شنروێ و کارەکانی کاک ئازاد و ڕەنگدانەوەی لەم کتێبەدا.

جۆری دووەمی فۆلکلۆر بریتییە لەو گۆرانی و تێکستانەی کە سەرچاوەی دروستبوونیان لە سنووری پارێزگاری هەڵەبجەوە دەستپێدەکات، هەندێکیان پێشتر بەهەموو کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە وەکو گۆرانی **{بەلەنجە گیان، یان ئەو گۆرانییانەی کە بە پاڕانەوە لە عەبابەیلێ دەست پێدەکەن:**

**{ یا عەبابەیلێ ماڵ بە بەرزەوە / یارم نەکوژی بەدەم لەرزەوە / یا عەبابەیلێ بەرت هەر بەردە/ بم کەی بەڕەفیق ئەو کراس زەردە. هتد}** چونکە کاتێک کچێکی هەڵەبجەیی لەگۆرانی لەنجەگیان بەلەنجە دەبێت بەگۆرانی، ئەوە ئەگەیەنێ کە سەرەتا کچی هەڵەبجە سەرنجی لاوەکانی ناوچەکەی خۆی ڕاکێشاوە ئینجا گەنجانی ناوچەکانی تر، بۆ عەبابەیلێش بەهەمان شێوەیە، کە سەرچاوەی دروستبوونی دێرە فۆلکلۆری و ئاوازەکان لەناوجەرگەی هەڵەبجەوە هەڵقوڵاوە، چونکە دانەرێکی دێرێکی فۆلکلۆری لە دهۆک یان هەولێر.. هتد لەسەردەمەکانی

ڕابردوودا کە هاتووچۆ سنووداربووە و هۆکاری ڕاگەیاندن نەبووە چوزانێ عەبابەیلێ چییەو کەوتۆتە کوێوە؟، بۆیە هەر دێڕێک یان چەند دێڕێکی فۆلکلۆری ڕەنگدانەوەو دروستبوونی سەرەتاکەی بۆ سنوری ناوچەکە خۆی دەگەڕێتەوە.

هەندێکیشی بەهەر هۆیەک بێت لە زیاتر لەسنووری هەڵەبجەدا ماوەتەوە، بۆ نمونە: **{کوزەڵەو بە نۆڵە ترشۆکەی شاخی / یارێکم هەیە لێم بووە یاخی}** هتد، سنووری هەڵەبجە بەناوبانگ بووە بە گیاو ڕووەکی سروشتی، لەناویاندا **{کوزەڵەو بەنۆڵە}** کە ڕۆژگارێک بووە لە سنووری شارەکە و خەڵکی شارەکە لەبەر دوو هۆکار زیاتر حەزیان لەسەوزەی سروشتی بووە، یەکەمیان سەوزە سروشتییەکان تایبەتمەندن بەوەرزێک. دووەمیان سەوزەو گیای سروشتی لەو وەرزەدا بەشێوەیەکی گشتی خەڵکی خۆیان هەوڵی بەدەستهێنانیان داوە و چونکە چواردەوری هەڵەبجە کانی و ئاو و سەیرانگابووە کە ئەمەش جگە لەسوودەکەی بڕێک پارەی بۆ خێزانەکان گل داوەتەوە، هەر سەبارەت بەکوزەڵەو بەنۆڵە چۆتە ناو شیعری نوسراوی کوردی ناوچەکە وەک لەشیعرێکی ڕووهەڵماڵراوی (حیلمی)دا دەبینرێ، لەگەڵ ئەمەشدا بۆتە نازناو بۆ هەندێ کەس، بۆ نمونە لە ڕۆژگارێکدا ئەگەر بتگوتایە **{خەجێ}** کەس نەیدەناسی، بەڵام ئەگەر لەهەڵەبجەدا بتگوتایە **{خەجێ گوزەڵە}** ئەوا خەڵکی شار هەموویان ئەیانزانی کە کێیە؟ لەمەدا دەردەکەوێت کە هەندێ کەس بژێوی ژیانی لەسەر گیای بەهاری یان سەوزەی سروشتی بووە، بە کورتی زۆر ئاساییە لە قۆناغێکیشدا چووبێتە ناو فۆلکلۆری کوردییەوە، بۆیە حەقی خۆیەتی بڵێین کە نەوەی ئەم سەردەمە بەگشتی لەکوردستاندا نازانێ **{کوزەڵەو بەنۆڵە}** چییە؟ سوودی ئەم کتێبەی کاک ئازاد و دیرە فۆلکلۆرییەکان، چەندین وشە لە فەوتان ڕزگار دەکات و وەک وتیشمان ئاشنایان دەکات بەو جۆرە سەوزەیەی کە لاوی کوردی ئەم سەردەمە نەدیویەتی، نە خواردوویەتی و نە ئەزانێ چییە؟.

لەبارەی شیعری نوسراوی کوردییەوە، تیپی مۆسیقای شنروێ و لەم کتێبەدا لە شیعری کلاسیکییەوە هەر لە نالی و مستەفا بەگی کوردییەوە تا دەگاتە شیعری گۆران و کامەران موکری و هتد وە شاعیرە تازەکانی ئەم سەردەمە لە ئاوازو گۆرانییەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، ئیتر ئایا شیعرەکە دڵداری بووبێ، یان تایبەت بووبێت بە کارەساتی ١٩٨٨/٣/١٦ کە شێرکۆ بێکەس جوانترین شیعری بۆ ئەو بۆنە خەمناکە نوسیوە.

(٦)

هەر لەم کتێبەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە تیپی مۆسیقای شنرویٔ بە هاوسەنگی گرنگی داوە بە گۆرانی بێژە دێرینەکان تا دەگاتە گەنجەکان، بۆ نمونە بۆ یەکەمجار تیپی مۆسیقای شنرویٔ هونەرمەندی بەناوبانگ **{عوسمان کێمنەیی}** هێناوەتە سەر تەلەفیزیۆن، ئەمە جگە لەوە گرنگی بە هونەرمەندی نەمر **{محەمەد ئیبراهیم عەبدول}** و**{عومەری خەزان}** و گۆرانی بێژی میللی **{ حەمە لامەرکەزی و مەحمود شێرالی }** داوە، هاوشانی ئەمانەش گەنجەکانی لەبیر نەکردووە، بۆ نمونە هونەرمەندێکی سەنگین و بەناوبانگی وەکو **{هۆشیار حەمە فەرەج}** لەلای کاک ئازاد و تیپی مۆسیقای شنرویٔ پێگەیشت و ناوبانگی دەرکرد، جگە لەمانەش کاک ئازاد وەکو لەم کتێبەدا دەردەکەوێت گرنگی داوە بە هونەرمەندانی شار و ناوچەکانی تری کوردستان بۆ نمونەی لوقمان سەلیم و نیان عەبدوڵڵا و هێدی و هتد.

ئەوەی جێی کەم و کورِی بێت لای زۆرێک لە هونەرمەندانی کوردستان و  وە هەروەها  لە تیپی مۆسیقای شنرویٔدا ئەوەیە کە ئەم تیپە و کاک ئازادیش : ١ـ گرنگی ئەوتۆیان نەداوە بە تیپی دەهۆڵ و زورنا و بەزمی شایی و شاد، رەنگە هۆکارەکەی بۆ ئەو نەهامەتیانە بگەڕێتەوە کە بەدرێژایی ساڵانی رابردوو ڕووبەڕووی هەڵەبجە بۆتەوە. وە کیمیا باران کردنی هەڵەبجە کاری کردۆتە سەر بەرهەمی تیپەکە بۆیە چەندین ئاواز و کۆراڵیان داناوە بەو بۆنە ماتەمە گەر ئەو هەموو نەهامەتیە نەهاتایە بەسەر ئەو شارەدا ئاوازی شاد و دڵنشین ڕەنگی دەدایەوە لە ناو بەرهەمەکانیان  ٢ـ دەوری تاک لەسەر شانۆ و تەلەفیزیۆن بۆ ژەندن و بەرهەمێنانی گۆرانییەک، هونەرمەندانی کورستان زۆر شانازی بەدەوری قەرەباڵخی و کۆڕاڵ و ئۆرکێستراو هتد سەر شانۆ و تەلەفیزیۆن دەکەن، لەکاتێکدا ئەم جۆرە بەرهەمانە زیاتر هی دەستەبژێرن، چونکە هونەرمەند خۆی دەزانیٔ گرنگی دابەشکردن و ئاواز و هتد چەند سەرکەوتووە یان نا؟ لەکاتێکدا بۆ گوێگرو بینەری ئاسایی دەوری تاک لەسەر شانۆو تەلەفیزیۆن دەبێتە ئەستێرە، چونکە کاتێک دوو سیٔ هونەرمەند لەگەڵ گۆرانی بێژێکدا بەرهەمێک دروستدەکەن لێرەدا ڕۆڵی بینەری ئاسایی زیاتر ڕادەکێشن، بە پێچەوانەی کۆڕاڵ و ئۆرکێسترا کە هەست و بینین و چێژەکان دابەش دەبن، هونەرمەندە کە بە تاک لەسەر شانۆ بۆ نمونە **{کەمان}** دەژەنێت و هەر خۆیەتی لەگەڵ یەک دوو ئالەتی تردا ئەمە هەر بەتەنیا گۆرانی و موزیک نییە، بەڵکو نواندنیشە، شانۆشە،  بەڵکو دەرخستنی توانایەکی تەواوە، وا لە بینەر دەکات تێروانین و گوێگرتن و هەستەکانی دابەش نەبێت و تەرکیزی لەسەر چێژی مۆسیقا ژەنەکەو گۆرانی بێژەکە بێت، بەڵام کاتێک سەر شانۆ قەرەباڵخ دەبێت بە ئالەتی جۆراو جۆر، بۆ گوێگری ئاسایی بە جۆرێک لە

فەوزا و قەرەباڵخی تێدەگات، وەکو لە کۆنسێرتی عەدنان کەریمی نامەکەی نالی بۆ سالم بینرا، کە گوێگر نەک چێژی لێ نەدەبینی، بەڵکو هەوڵیش ئەدا هۆڵەکە تێکبدات، ئەمە بۆ تیپی شنرویێ و هەموو تیپەکانی تری کوردستان ڕاستە، بەکورتی لە ئۆکێستراو کۆراڵدا لەگەڵ ئەوەی کە ئیشەکە قورسە و کۆکردنەوەی کۆمەڵێک هونەرمەند و کۆرس و گۆرانی بێژ ئاسان نییە، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەو چێژەی نییە کە تاک لەسەر شانۆ، یان لەبەردەم کامێردا دەبینێ.

**(٧)**

ڕوویەکی تری گەشی ئەم کتێبە لەوەدایە کە کاک ئازاد هەر بەتەنیا نەهاتووە نۆتەو شیعرەکە بنوسێتەوە، بەڵکو زۆر بەجوانی و بە ئەمانەتەوە هاتووە ناوی گۆرانی بێژەکەی نوسیوە، وە بە پێی تواناش ئەوەندەی وێنەی لەبەردەستدا بووبێت، یان کاتی خۆی وێنەکە گیرابێت، هاتووە وێنەکەی لەپاڵ بەرهەمەکەدا داناوە، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر پارچە مۆسیقایەک {بەبێ گۆرانی} کاتی خۆی سوودی لێوەرگیرابێ، ئەوا نۆتەی پارچە مۆسیقاکەی نوسیوەتەوە وەکو لەبەرهەمی پارچە مۆسیقای {نیگا}ی خالید سەرکاردا دەبینرێ. وە هەروەها بەرهەمی پارچە مۆسیقای خودی کاک ئازادیش دەبینرێ وەکو لەبەرهەمی **{شنەی مۆردانە و یادی هاوار}**ی ساڵی ١٩٨٠ دەبینرێ. لەگەڵ ئەمەشدا تیپی شنرویێ و کاک ئازاد لە پێناوی بەرەوپێش خستنی شانۆی کوردی بەگشتی و ئۆپەرێتی منالان، هاتووە ئاوازی جۆراوجۆری بۆ منالان داناوەو سەردەمانێک ڕەنگی داوەتەوە لەناو کۆمەڵگای کوردیدا وەکو لەبەرهەمی {سەوزە} و چەندین بەرهەمی تردا دەبینرێ.

لەکۆتاییدا پێویستە ئەو ڕاستییە بخەینە ڕوو، کە ئەم کتێبە مەرج نییە سەرانسەری بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای شنرویێ و کاک ئازادساڵحی تێدابێت، بەڵام خۆشبەختانە زۆربەی تێدایە، هیوادارین هەم شیعری گۆرانییەکان چێژ، لەلای خوێنەر دروستبکات، وە نۆتەکانیش سوودی بۆ برا و خوشکانی هونەرمەند هەبێت و داواکاریشین لەکاک ئازاد ئەو ڕێگایەی کە گرتوویەتییە بەر بۆ خستنە ڕوو وە ڕاڤەی تێکست و وەرگێران و نۆتەی هەندێ گۆرانی **{واتە جگە لە بەرهەمەکانی خۆیی و تیپی مۆسیقای شنرویێ}** ، هەر بەردەوام بێت و خوێنەرانی ئەم سەردەمە ئاشنا بکات بەو شاکارانەی لەڕابردوودا بەرهەم هاتوون، هیوای تەمەن درێژی و تەندروستی باش بۆ کاک ئازاد دەخوازین.

## خوێندنەوەیەک

خوێندنەوەیەک بۆ کتێبی (**هەڵەبجە و سەمای نۆتەکان**) ی مامۆستای هونەرمەند ئازاد ساڵح

ئاشکرایە بواری نووسین و لێکدانەوە لەمەڕ موزیک بە گشتی و بەتایبەت موزیکی کوردی لە هەنگاوەکانی سەرەتایدایە... هۆکارەکەشی ڕوونە، کە نووسین لەم بوارە کارێکی ئاسان نییەوە یەکێک توانا و سەلیقە و باک گراوندێکی ڕۆشنبیری هونەری موزیکی نەبێت، ئەستەمە بتوانێت خۆی لە قەرەی ئەم کارە بدات! بۆیە لە باشووری کوردستان ئەو موزیککارانەی دەنووسن دانسقەن و بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن!

لەو نووسەرە دانسقانە مامۆستا ئازادە، کەمن بۆ خۆم یەکەم جار ئاشنا بووم بە دەستو قەڵەمی ئەو کاتە بوو، کە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری(شاکار) بووم، ئەم دوو نووسینەی مامۆستام بۆ هەڵسەنگاندن کەوتە بەردەست تا لە گۆڤارەکەدا بۆی بڵاوبکەینەوە:

**یەکەم :** چێژ و فۆرم لە جوانکاری مۆسیقادا

**دووەم :** پرۆشەی هەستی مرۆی لە سەمفۆنیاکانی بتهوڤن

بۆمن جێگەی سەرسوڕمان بوو کە مامۆستا ئازاد دەرچووی ناوەندێکی خوێندنی هونەری موزیک نەبێت و ئەم نووسینانەی هەبێت، کە ئەمانە بۆ خۆیان لە باکگراوندێکی ڕۆشنبیری موزیکەوە سەرچاوە دەگرن، یەکێک ڕۆشنبیری موزیکی نەبێت ناتوانێت ئەم نووسینانەی هەبێت!! بۆیە بۆ ئێستای من نامۆ نییە، کە ببینم مامۆستا ئازاد شاکارێک لە نووسین پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی دەکات.

کتێبی (سەمای نۆتەکان) پێمان دەڵێت، کە مامۆستا ئازاد چەندە پەرۆشی هونەری موزیکی کوردییە دەرویش ئاسا بەو پەڕی دڵسۆزییەوە لە خانەقای موزیکی کوردی کاری کردووە، ئەو زۆر بە باشی لە ڕۆڵ و کاریگەری موزیک و گۆرانی و بۆسەر کۆمەڵگەکەی وەک دیاردەیەکی شارستانی تێگەیشتووە و موزیک لە ڕۆحیا هەمیشە گوزەردەکات و دەیەوێت لەڕێی کارەکانییەوە پەپوولە ئاسا ڕۆحی خۆی پێشکەش بە گوێگرانی بکات، لەڕێی ئەم کتێبەوە پێمان دەڵێت، کە هەڵەبجە مەڵبەندی شارستانییەتەوە لەسەر وتە بەنرخەکەی کۆنفۆشیۆس(ئەگەر دەتانەوێت ئاستی شارستانییەتی هەڵەبجەکەم بزانن فەرموو سەیری کارە موزیکییەکانمان بکەن) ئەمە پەیامە درووستەکەی ئازاد ساڵحی هونەرمەندی ماندوو نەناسی نەتەوەکەمانە.

ناوەرۆکی ئەم کتێبە گێڕانەوەی کار و چالاکییە هونەرییەکانی مامۆستا ئازادە، لەگەڵ ئەو هاوڕێ موزیسیانەی کە لەگەڵی کاری ئاواز دانان و ئامادەکاری موزیکیان کردوە لەوانە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی تیپەکەوە( ڕەوان شاد ئومێد نوری ، هوشیار حەمە فەرەج ، عەزیز حەمە کەریم ،ئاراس شێخ جەمال .ڕزگار شێخ صدیق .عادل حەسەن ،توانا خورشید ،وە چەندینی تر ).کە خۆی سەرقافڵەی کاروانی هونەری موزیک بووە لە ڕێکەوتی ١٩٧٣/٤/٢٦ کە تیپی مۆسیقای هەڵەبجە دامەزراوە، لەو کاتەوە تائێستا سەرجەم چالاکییە هونەرییەکانی بە ئاهەنگ وکۆنسێرتەکان و خولی فێربوون و تۆماری بەرهەمەکان بە هەموو شێوەکانی گۆرانیی و موزیک بە نۆتی موزیک بەرجەستە دەکات، کە بۆ خۆی خاڵی جیاواز لەم کارە ئەمەیە!! جگە لەوەی کە باسی هەر گۆرانی و پارچە موزیکێک کرابێت ئەم ناوی شاعیرو ئاوازدانەر و ئامادەکاری موزیک و بەشدارانی نووسیوە، کە ئەمە بۆ خۆی کارێکی دەگمەنە و یەکەم جارە ببینم بە تایبەت لە باشووری کوردستان و عێراقیش کتێبێک ببینم لە شێوەی بیرەوەری موزیسیانێک، بەرنامەی کار و بەرهەمە هونەرییەکان بە نۆتی موزیک کرابن.

ئەم کتێبە ئەرشیفێکی تەواوی نزیکەی نیوسەدەیە، کە دەتوانرێت لە داهاتوودا تویژەران زۆر بەئاسانی زانیاری درووستی بێ پێچوو پەنای بۆ هەوێنی نووسینەوەی مێژووی هونەری موزیک و گۆرانی شاری هەڵەبجەو شارەزوورو هەورامان لێهەڵبێنجێنن، بۆیە من پێم باش بوو کتێبەکە بە ناوی(مێژووی موزیکی هاوچەرخی شاری هەڵەبجە لە بیرەوەرییەکانی مامۆستا ئازاد)ەوە بوایە، لەبەرئەوەی گێڕانەوەی بیرەوەرییەکان بە پێی ڕۆژ و مانگ و ساڵ ڕیزبەندی بۆ کراوە، کە ئەمە زۆر درووست و بێ وێنەیە.

هەندێک وێنەی چالاکییە هونەرییەکانیش خراونەتە ڕوو کە ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن.

هەندێک لە نۆتەکان بە پێی ئەو ناوانەی نووسراون ئاوازەکانیان جیایە بۆ نموونە گۆرانی (شەماڵ بیشەنێ گیانە یەخەی کەتانت)، من بۆ خۆم بەلامەوە سەیر بوو، چونکە ئاوازەکە بە پێی وشەکان بە جۆرێکی تر لای من تۆمارە و نۆتەکە لێرەدا ئاوازێکی ترە!! دوای دڵنیا بوون بۆم دەرکەوت کە ئەمە ئاوازێکی جیایە لەسەر هەمان هۆنراوە.

بەپێی یادەوەری بەڕێزیان ناوی بەشداربوانی کۆرسیشی لە بیرنەکردووە...ئەمەش بەڵگەیەکی زیندووی تری کارە جوانەکەی نووسەرە.

هەندێک لە ئاوازەکانیش وەک چینی دەنگی و وەک ئەوەی بێژراوە بیری نەماوە، لە سەر دەنگی یەکێکی تری نووسیوەتەوە، بۆ نموونە گۆرانی(کەتان کەتانە) خۆی ڕاستگۆیانە ئاماژەی

پێدەدات دەڵێت لەسەر کەتانەکەی هونەرمەند(ناسرِ ڕەزازی) نووسیومەتەوە. یاخود گۆرانی(ئەو هیوای لە پێی ژیام) ساڵی ١٩٧٤ یەکەم ئاوازی مامۆستا ئازاد ساڵحە و دەڵێت سوودم لە شمشاڵەکەی مینەی لولک ژەن وەرگرتووە. یان بەرهەم هەیە ڕاستگۆیانە نووسەر دەڵێت: بە داخەوە هیچیم لە ئاوازەکە بیر نەماوە بۆیە نۆتەکەیم نەنووسیوەتەوە!

دوای خوێندنەوەی کتێبەکەی بەووردی و بژاردن و جیاکردنەوەی بەرهەمەکان، بەگشتی (٢٠١) بەرهەمی بە نۆتی موزیک بۆ تۆمارکردووین کە لەناویاندا ( ١٥٣) دانەیان گۆرانی فۆلکلۆر و دانراون، (٢٠) دانەیان سروودن،(٧) تابلۆ و ئۆپەرێتی سەر شانۆن، (٣) کۆڕاڵ، (٥) پارچە موزیک، (١٣) گۆرانی منالان، تەنانەت نۆتی ئەو ئاوازانەشی جیاکردۆتەوە، کە پێشکەشنەکراون و تۆماریش نەکراون وەک بەرهەمی(کۆترە باریکە).

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مامۆستا لە زۆرێک لە بوارەکانی موزیک کاری کردووەو تەنیا بە گۆرانییەوە نەوەستاوە.

لەگەڵ نووسینەوەی هەندێک لە نۆتەکان مامۆستا ئاماژەی بە ناوی ئەو ڕەگەز و پەیژانە داوە، کە گۆرانییەکە یان کارەکەی لەسەر بنیاتنراوە، هەندێک لەکارەکان بە دووهێڵ نووسراونەتەوە، واتە ڕۆڵی هێڵی موزیکی هاوشانییە موزیکییەکەشی نووسیوەتەوە و ئاماژەی بە جۆری خێرای( تێمپۆی) کارەکانیش داوە.

بەگشتی ئەم نۆتانە بۆ ئارەزوومەندانو فێرخوازانی بواری موزیک و گۆرانی بەردەستنو سوودیان لێوەردەگیرێت، کە لە داهاتووشدا دەتوانرێت وەک نۆتی ڕاهێنان(ئاتوود)ێک بۆ فێربوونی ئامێرە موزیکییە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکان سوودیان لێوەربگیرێت، لە بری ئەوەی لەسەر ئاوازی ڕۆژئاوایی فێرخوازان ڕاهێنان بکەن، دەکرێت لەسەرەتاوە فێرخوازانی کوردی بواری موزیک بەم نۆتەی گۆرانییە کوردییانە گۆشبکرێن کە دڵنیام چێژی زیاتریان پێدەبەخشێت!!

پێش خستنە ڕووی نۆتەی کارەکان، مامۆستا هۆنراوەی گۆرانیی و سروود و کۆڕاڵو ئۆپەرێتەکانیشی نووسیوەتەوە، کە هەندێکیان بە تەواوی هۆنراوەی کارەکان خراونەتە ڕوو لە هەندێکیشیان بە کۆپلەیەک یان دووان، ئەمەش بۆ خۆی ئاسانکارییەکی تەواوە بۆ ئایندە لە ڕێی ئەم کتێبەوە هەر کارێکت لەوانەی کە یاداشتکراون بە تەواوەتی بەردەستە.

هەندێک لەنۆتەی میلۆدی ساتی گۆرانییەکان بە وشەی هۆنراوەکان نۆت بە نۆت ژێر نووس کراون، بەڵام لە هەندێک کاردا ئەمە نەکراوە هۆنراوەکە بەگشتی لەسەر نۆتەکان دانراون بێ جیاکردنەوە.وەک گۆرانی (لەم شارەدا، جێ ژوانم).

لە کۆتاییدا ئومێدی بەردەوامی وسەرکەوتنی زیاتر بۆ برای هونەرمەند کاک ئازاد ساڵح دەخوازم  دەستی ماندوو بوونی دەگوشم، پێی دەڵێم بەم کارەت پێشەنگییەکی ترت بۆ شاری هەڵەبجەی شەهید تۆمارکرد بەم کارانە ناسنامەی نەتەوەیمان زیاتر دەپارێزرێت... ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە دوژمنانی نەتەوەکەمان چەندە بیانەوێت بە زەبری هێز و تۆپ و تانکی سەربازی بیانەوێت بمانچەوسێننەوە و ناسنامەی نەتەوایەتیمان بسڕنەوە، خەیاڵیان خاوە، تا هونەر هەبێت ناسنامەی نەتەوایەتیمان پارێزراوە، ئەم کتێبەش وەک بەڵگەیەک، ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگری ناسنامەی زیندووی گەلە ستەم دیدەکەمانە.

**د . عادل محەمەد کەریم**

## تیپی مۆسیقای هەڵەبجەو نۆتەی سرودێکی نەبیستراو بەناوی کوردستان

وەک بارانی بەخوڕی بەهار کە چۆن تاوێک بەلێزمەو ڕێژنە دێتە خوارەوە، ئێمەش کۆمەڵێک گەنجی هەڵەبجەیی بووین، ئاوات و ئومێدمان هەبوو کە تیپێکی موزیک دامەزرێنین، پێش ئێمە هەوڵی بچوک بچوک هەبوون،بەڵام بەردەوام نەبوون، ئێمە دەمانویست بناغەکەی بەجۆرێک پتەوبێت، بەجۆرێک بێت هەرگیز لەدرەوشانەوە نەکەوێت، چونکە عەشقی مۆزیک لەرۆحماندا، لەگیانماندابوو، ئەوەبوو دەرفەت هاتە پێشەوەو لەڕۆژی ١٩٧٣/٤/٢٦ تیپی مۆسیقای هەڵەبجە دامەزرا لەلایەن ئەم بەرێزانەوە: ١ـ مستەفا کەمال خەفاف ٢ـ ئومێد نوری ٣ـ ئازاد سالح. پاشان چەند ئەندامێکی تر بەشداربوون لەوانە ١ـ حیکمەت تۆفیق ٢ـ ئازاد مەحمود سەراج. پاش ماوەیەکی تر کە چووینە بارەگای یەکێتی قوتابیانی کوردستان، ئەم ناوانەی تر هاتنە تیپەکەوە چ وەک مۆزیکژەن یان گۆرانی بێژ کە ناویان لەو خشتەیەدا هاتووە کە لەگەڵمان بەشدار بوون:

| ژ | ناوی بەشدار بوو | ناوی ئامێر | جۆری بەشدار بوون |
|---|---|---|---|
| ١ | ئازاد سالح سابیر | ئامێری کەمانچە | موزیک ژەن |
| ١٠ | سیروان عەلی ڕەزا | | گۆرانی بێژ |
| ١١ | هۆشیاری ئامەی زەریف | | گۆرانی بێژ |
| ١٢ | بەختیار وەستا هاشم | | گۆرانی بێژ |
| ١٣ | سەربەست ڕەئوف تەوێڵەیی | | گۆرانی بێژ |
| ١٤ | بەختیار محەمەد مەحمود | | کۆرس |
| ١٥ | ئیبراهیم شێخ ساحب | | کۆرس |
| ١٦ | کامەران کەمال خەفاف | | کۆرس |
| ١٧ | واحید مەلا ئەحمەد خەرامان | | کۆرس |
| ١٨ | سەرکەوت ئەحمەد مەحمود | | کۆرس |
| ٢ | مسەتەفا کەمال خەفاف | ئامێری کەمانچە | موزیک ژەن |
| ٣ | فوئاد محەمەد مەحمود | ئامێری کەمانچە | موزیک ژەن |
| ٤ | ئومێد نوری محمد | ئۆکۆردیۆن | موزیک ژەن |
| ٥ | حیکمەت تۆفیق | شمشاڵ | موزیک ژەن |
| ٦ | عەزیز مەحمود مستەفابەگ | دەف زنجار | موزیک ژەن |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧ | شازاد شێخ کەریم نەقشبەندی | ئیقاع | موزیک ژەن |
| ٨ | سەرکۆ ئەحمەد | | گۆرانی بێژ |
| ٩ | بورهان عبدالرحمن چاوەش | | گۆرانی بێژ |

## یەکەمین چالاکی هونەری تیپی مۆسیقای هەڵەبجە

یەکەمین چالاکی هونەریمان کە لە ڕێکەوتی ١٩٧٣/٧/١٤ لە هۆڵی ئامادەیی کچان لە نزیک سەرووی بینای (سەرا) هەڵەبجە پێشکەش کرا بۆ ماوەی (٥) ڕۆژ کە لە کاتی شەو پێشکەش دەکرا. پاشان لە ڕێکەوتی ١٩٧٣/٧/٢٠ بۆ ماوەی دوو شەو لە شارۆچکەی (تەوێڵە) وپاشان دوو شەو لە خورماڵ، ئینجا دوو شەو لە پێنجوێن پێشکەش کران، ئەندامانی بەشداربوو بریتی بوون لەم ناوانەی کە لەم خشتەی خوارەوەدا ناویان هاتوە چ وەک مۆزیک ژەن چ وەک گۆرانیبێژ چ وەک کۆرس. ئەم بەرهەمانە لە گەڵ تیپی نواندنی هەڵەبجە پێشکەش کران کە بە شانۆگەیەک بەشدار بوون لە نوسینی محەمەد غەفور شەریف و دەرهێنانی جەمال مەلا قادر بە ناوی(وزەی بیرو بازوو):

**وە لەم ئاهەنگەدا ئەم گۆرانییانە پێشکەش کران:**

| ژ | ناوی گۆرانی بێژ | ناوی گۆرانی یان موزیک | هۆنراوە | ئاواز یان ئامادەکردن |
|---|---|---|---|---|
| ١ | کۆرس | سروودی کوردستان | ئومێد نوری | ئومێد نوری |
| ٢ | سەرکۆ ئەحمەد | شیرین هەلامە | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر |
| ٣ | سەرکۆ ئەحمەد | مەمکۆژە بەناز | فۆلکلۆر | ئاوازێکی میسری |
| ٤ | هۆشیار ئامەی زەریف | جوانی لای بانە | حەسەن زیرەک | حەسەن زیرەک |
| ٥ | بەختیار وەستا هاشم | ڕاستەی خیابان | فۆلکلۆر | عەلی مەردان |
| ٦ | بورهان عبدالرحمن | لایەلایەت بۆ ئەکەم | حەسەن زیرەک | حەسەن زیرەک |
| ٧ | سیروان عەلی ڕەزا | ڕەفیقان | کوردی | سروان عەلی ڕەزا |
| ٨ | سەربەست ڕەئوف | بەلەنجە گیان | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر |




**شوێن** / هەڵەبجە – بارەگای یەکێتی قوتابیان — ساڵی ١٩٧٣ – کاتی پرۆڤە کردن — کامێرای سەروەتی حاجی حەمە کەریم کوردستانی

**دانیشتوەکان لەڕاستەوە:** ١. عەزیزبابان ٢. سەروەت حەمەکەریم کوردستانی ٣ . ئومێد نوری ٤. فوئاد محەمەد محمود ٥ . ئازاد ساڵح ٦. وەستاوەکە : مستەفا کەمال خەفاف ٧. گۆرانی بێژەکە :سەرکۆ ئەحمەد

**کۆرسەکان لەڕاستەوە:** ١. ئەسکەندەر حەمە فەرەج ٢. خەڵەف سەعید خەڵەف ٣. نەوزاد حاجی ئەمین ٤. سەرکەوت ئەحمەد ٥. سەفادین

# نۆتەی گۆرانییەکانی ١٩٧٣/٧/١٤

## سروودی : کوردستان

### کوردستان

ئاوازو هۆنراوە:ئومێد نوری
ووتنی :کۆرس
ساڵ : ١٩٧٣
مەقامی کورد لەسەر دەنگی لا

♩=110

کور دس تان کور دس تان___ جێی د ل ێ ر و نه به زان___

5
جێ ی سه ی ه رۆ قا کی ره مان پێ شه وا ی گه ی لی کور د مان___

9
مه__ لا مس ته فا ی بەر ی زا ن

کوردستان کوردستان جێ ی دلێرو نەبەزان
جێی سەرۆکی قارەمان پێشەوای گەلی کوردمان
مـــــەلا مســــــتەفـــای بــــــــــــــەرزان

# گۆرانی دووهەم (٢) شیرین هەلامە

## شیرین هەلامە

هۆنراوەو ئاوازی :فۆلکلۆر
ووتنی :سەرکۆ ئەحمەد
ساڵی 1973
مەقامی نەهاوەند لە سەر دەنگی (دۆ)

♩ = 110

music 1

song 1

music 2

song 2

song 1

شیربن هەلامە شیرین هەلامە بەو دەسرەی دەستت کارم تەمامە )2
ئەرێ هەستە بیرە لام گیانە قەت مەچۆرەوە )2
ئەرێ خەمی کۆنەو نوێم لە بیر بەرەوە لەبیر بەرەوە )2
شیرین هەلامە شیرین هەلامە بەو دەسرەی دەستت کارم تەمامە

# گۆرانی سێهەم (٣) مەمکوژە بە ناز

مەمکوژە بە ناز

ئاوازی عەرەبی (میسر)
هۆنراوەی :فۆلکلۆر
ووتنی :سەرکۆ ئەحمەد
ساڵی:1973
مەقامی نەهاوەند (دۆ)

♩ = 120
music 1

song 1

مەمکوژە بە ناز شل و مل و خاڵ لەمل    مەمکوژە بە ناز شل و مل و خال لەمل
قەستەم بەو دوو چاوە جوانە    ئای چەند جوانە
ڕیشەی دڵمی دەرهێناوە  ئای چەند جوانە
مەم کوژە بە ناز شل و مل و خاڵ لەمل  شل و مل و خاڵ لە مل

# گۆرانی چوارەم (٤) جوانی لای بانە

جوانی لای بانە

هۆنراوەو ئاوازی:حەسەن زیرەك
ووتنی ووشیار ئامەی زەریف
مەقامی (حجاز )

♩ = 110
musik

tr
tr

10

song

م - ب ل ش ل ش ی___ئا

20

م خ ە ز نە ێ ن ێ ن م ب وە ___تە با ن ە ب ن ___ت و و ک

29

نی جوا مل لە ڵ خا ل ش ە م ە ک وە ___ە ت نا گۆ ر سە _گیان ی

39

ت__چ ا م و نە ێ ب ە د نە ___با لای نی وا ج ن جوا

47

نە ___ما رە مەح بە خ ئا نە ___لا کۆ بچ م دە م کە

ئـــــای
شل شل بم کوتن بە نەباتەوە  بمنێنە زەخمی گیان سەر گۆناتەوە
کەمەرە شل خاڵ لە مل جوانی جوان جوانی لای بانە
دەبێنە و ماچت کەم دەم بچکۆلانە
ئاخ بە مەحرەمانە

# گۆرانی پێنجەم (٥)ڕاستەی خیابان

ڕاستەی خیابان – فۆلکلۆر

ئەرێ ڕاستەی خیابان نەشمیل گیان باخچەی میللەتی      وەڵا کراسەکەی بەری چاو جوان چیتی شیرکەتی
ئەرێ لای لای لای کەوی گەردەن بە خـــــــــــاڵی      گیـــان گیـــان گیـــان تـــۆ منـــداڵی چـــوارده ســـاڵی
ئەرێ بێنە سـەر دڵـم چـاو جوان ناسکە پەنـجەکەت      ئەرێ باوەشـــــێنم کە ورد ورد بە ئەگـــــریجەکەت
ئەرێ لای لای لای کەوی گەردەن بە خـــــــــــاڵی      گیـــان گیـــان گیـــان تـــۆ منـــداڵی چـــوارده ســـاڵی

ڕاستەی خیابان

هۆنراوەی :فۆلکلۆر
ئاوازی عەلی مەردان
ووتنی بەختیار وەستا هاشم
ساڵی :1973
مەقامی (ڕاست)

♩ =80

music

6

12

song

ئه ر ێ ڕاس تەی

18

ـــرت ە ب ی کە سە کرا ڵا ە و تی ـــە ل می چەی خ با م کە نە گیا ـــ بان ـــ ا خی

23

دن ر گە وی کە ی لا ی ا ل ی ا ل ی ا ل کەتی ر ـــی ش تی یە چ ن وا ج چاو

28

ڵی سا دە ر چوا ڵی ا من ۆ ت ن گیا ن ا گی ن ا گی ی ـــ ڵ خا بە

## گۆرانی شەشەم (٦) لایەلایەت بۆ دەکەم

گلەیی دەکەم دایم من بەلای خوداوە — ئەی هاوارمن بەلای خوداوە
دەروازەی مەینەت بۆچی بۆ من کراوە — ئەی هاوار بۆمن کراوە
لایە لایەت بۆ دەکەم — بەڵکو خەو بت باتەوە
دەست خەمە نێو مەمکۆڵانی — شەو تا ڕۆژ من بەلاتەوە
یان خرخاڵ بم شەو بە پاتەوە — یان خرخاڵ بم شەو بە پاتەوە

لایە لایەت بۆ دەکەم

هۆنراوەی :فۆلکلۆر
ئاوازی حەسەن زیرەک
ووتنی برهان عبدالرحمن
ساڵی :1973
مەقامی عەجەم

♩ = 85
musik

7

13

19 song

گ له یی ده که م دای م من به لای خو د ا و ه ئەی ها وا ر

25

من به لای خو د ا ه ا__ و وه من به لای خو د ا ه ا__ وه لا یی لا یه ت ب ۆ دەکەم

31

بەڵ کو خه و بت ب ا ته وه مه خه دەست ی ن لا کۆ مەم نێو

35

ش ه و تا ڕۆژ من ب ی لا تەوە یان خ ڕ خاڵ ب م شەو به پا ته وه

# گۆرانی حەوتەم (٧) ڕەفیقان

**شیعری (نالی یان مستەفا بەگی کوردی)، چونکە لەهەردوو دیوانی کوردی و نالی دا ئەم شیعرە بڵاوکراوەتەوە:**

| | |
|---|---|
| ڕەفیقـــان مـــن ئەوا ڕۆیـــیم لە لاتـــان | لە مەزلومـــان بـــەڵا چـــۆڵ بـــێ وڵاتـــان |
| مەلـێن کـەڵکی نەبـوو ڕۆیی جەهـەننەم | ســـەرم قەڵغـــانە بـــۆ تیـــری قەضـــاتان |
| ڕەفیقـــان مـــن ئەوا ڕۆیـــیم لە لاتـــان | لە مەزلومـــان بـــەڵا چـــۆڵ بـــێ وڵاتـــان |

ڕەفیقان

ئاوازو ووتنی :سیروان عملی ڕەزا
هۆنراوەی : نالی
ئامادە کردنی :ئازاد سالح
1973
مقامی حجاز

♩ = 90

music1

8 song1

14 music

20

26 song2

32

# گۆرانی هەشتەم (٨) به لەنجه گیان به لەنجه

به لەنجه گیان

هۆنراوەو ئاوازی :فۆلكلۆر
ووتنی :سەربەست ڕەئوف تەوێڵەیی
ساڵی 1973
مەقامی (حیجاز كار )

♩ = 100 music

6

song

به لەنجه گ یا ن به ل ه ن ج__ ه

11

ت ۆ و ه ره ب ه لا رو ل ه__ ن ج__ ه

با ره س ی و

14

ب ا ر ی کر د وه ب ۆ ش ا ره ک ه ی هه ڵ ه لَه ب ج ه

به لەنجه گیان به لەنجه تۆ مەرۆ به لارو لەنجه  باره سێو باری كردوە بۆ شارەكەی هەڵەبجە
به لەنجه گیان به لەنجه دەستووری تاڵەبانی  ڕووی خەسوەكەت ڕەش بێت وەی بەردەرگات پێ ئەماڵێ

## شیعرو ئاوازێکی نەتەوەیی

ئـاهەنگی دووهەمـی تیپـی مـۆزیکی هەڵەبـجە لە ڕێکـەوتی ١٩٧٣/٨/١٦ بـوو، ئەو کـاتە یـادی دامەزراندنی (پ.د .ک ) بوو. ئێمە ئەو کاتە بارەگاکەمان واتە بارەگای تیپەکەمان هەر لە یەکێتی قوتابیان بوو، داوایان لێ کردین کەئاهـەنگێک بگێڕین بەو بۆنەیەوە. هەرچی چالاکی هەبوایە حەزم ئەکرد بەشداربم، بۆ ئەو مەبەستەش چەند ڕۆژێک لە یەکێتی قوتابیان پرۆڤەمان لە چەند بەرهەمێک کـرد، یەک دوو کەسـی تـر پەیوەنـدیان پێـوە کـردین یەکێـک لەوانە کـاک {پەیمـان حسـین} بـوو کە دەبـوایە ئـامێرێکی بژەنـدایە کە مـۆرکی مارشـی سـەربازی بێـت، بـۆ ئەم مەبەسـتەش ئـامێرێکی (صـەنج )یـان پەیدا کردبوو کە بریتـی بـوو لە دوو بـازنەی مس کەوەک دوو ساج وابوون ئەدران بە یەکدا ودەنگێکی زرنگدانەوەی هەبوو، ئەبوایە جلی کوردیمـان لە بەربوایە، {پەیمان حسین} پانتۆڵی لەبەر بوو، نـازانم چـۆن شـەرواڵ و کراسـێکی پەیداکردبوو، وە کورسـییەکانمان بـۆ دانیشـتن کـەمبوو، مـن و مسـتەفا بـۆ کەمانەکـان دانیشـتبوین .فوئـادی حەمەی مەحمود ئەفەندی بەپێوە لە پاڵ من وەستا بوو، کە قاچی دەدا بە زەویدا هەموو گیـانی منی کردبوو بە تەپ و تۆز. ئەم ئاهەنگە لە گۆڕەپـانی پشـتەوەی سـانەوی کـوڕانی ئەو کـاتەی هەڵەبجە نمایش کرا، کات عەسرێک بوو وە ئەو کەسانەی بەشدار بوون: تیپی کۆرس بـوون کە سروودی (سڵاو لە پارتی دیموکراتی کورد)یـان گـووت، عـومەری خەزانیش مەقـامی هەمـایۆنی وت کە بەشیعری (مانگی کورد لە ئاسمان ئەدرەوشێتەوە) دەسـتی پێکـرد و پاشـان بە گـۆرانی (کۆچی یارم کـۆچی سـوورە) دوایـی پێهێنـا، من هەر ئەو دوو بەرهەمەم لە یـادە کە لەو بـۆنەدا پێشکەشمان کرد بۆیە نۆتەکانیان دەنوسمەوە:

**سروودی : سڵاو لە پارتی دیموکراتی کورد**

**هۆنراوەو ئاوازی** خالد دلێر

**وتنی :** کۆرس

ڕێکەوتی پێشکەش کردن ١٩٧٣/٨/١٦

مەقامی (عەجەم ) لە سەر دەنگی (ڕێ ) یان(ڕی مایجۆر)

دەقی ئەو شیعرەی کە لە بیرم ماوە :

ســـــڵاو لە پـــارتی دیمـــوکراتی کـــورد ئەوپـــــارتەی ئـــاڵای شۆڕشـــی هەڵکـــرد

لەو پێشـــڕەوە بێــت کە پێشــــمەرگەکەی بەرەو ڕزگـــــاری کوردســـــتان ئەبـــرد

ئەی پــــارتی نەبەز ئەی لانەی شـــێران ئەی هەق ســـێنەری کـــوردی قارەمـــان

ئـــێمە پێشــــمەرگەی کـــۆڵنەدەری تـــۆین لەڕێگـــــای تــــۆدا ئەبـــین بە قوربـــان

سڵاو لە پارتی

♩=120
music

5

سڵاو لە پارتی

9
song

کرد هەڵ شی ڕ شۆ ی ئاڵا ی تە ر پا و ئە د کور تی را ک مو ی د ی ت ر پا ە ل و سڵا

ئەبرد ن تا دس کور ی ــــر گا ز ڕ رەو بە کەی گە مەر پێش کە ێ ب وە ڕە ش پی و لە

## چریکەی هونەرمەند عومەری خەزان لەگۆرانی کۆچی یارمدا

**گۆرانی : کۆچی یارم**

**هۆنراوەی :** (محەمەدی ماملێ ئەم گۆرانییەی وتووە)

**ئاواز :** فۆلکلۆر

وتنی :عومەری خەزان

ڕێکەوتی ١٦/٨/١٩٧٣

کـــــۆچی یــــارم کــــۆچی ســـــوورە    بەهـــــــــــارە خێـــــــــڵ بەرەو ژوورە

ڕەبــــــی قاســــــید کـــــوڕت بمـــــرێ    یـــاخودا ئەو کـــۆچەت ســـەر نەگـــرێ

چونکە یـارم لە مـن دوورە لە من دوورە    چونکە یارم لە من دوورە لە من دوورە

کۆچی یارم

♩=110 music

song

گۆرانی کەویاری حەسەن زیرەک بەدەنگی مستەفا کەمال خەفاف

ئـاهەنگی سـێهەمی تیپـی مـۆزیکی هەڵەبـجە لەڕێکـەوتی ١٩٧٣/٩/١١ بە بـۆنەی هەڵگیرسـانی شۆڕشـی ئەیلـول، کـاتی عەسـرەکەی بەردەم یەکێتـی لاوانـی دیمـوکراتی کوردسـتان ئەو کـاتە بیناکەیان بەرامبەر ئۆرزدی باکی کۆنی هەڵەبجە بوو، ئەوەی لەبیرم بێت ئەویش یەک گۆرانی حەسەن زیرەکە بە ناوی (کەویار ) کە ئەویش مستەفای کەمـال خەفـاف کەمـانی دەژەنی و ئەم گۆرانییەشی وت، لە ناوەڕاستی گۆرانییەکەدا مەقامێکی وت، هـەروەها خەڵکـانێکی زۆر ئامـادەی بوون، کاتێ کە لە نمایش کرد بووینەوە من و ئومێدی نوری حەمـەی نانـەوا و مسـتەفا کـەمال خـەفاف و وفوئـادی حەمەی مـەحمود ئەفەنـدی چـووین بـۆ چایخـانەکەی (ئەوڕەحمـانی سـەعە گۆچان ) کە ناسراو بوو بە (خـاڵە) بە مسـتەفای وت مەقـامەکەت زۆر خـۆش وت، ئەو کـاتە لە هەر شوێنێک ئاهەنگ ببوایە چەندین کەس ئامادە ئەبوون بۆ بینینی .

**گۆرانی : کەویار**

**هۆنراوەو ئاواز:** حەسەن زیرەک

**وتنی** : مستەفا کەمال خەفاف

ڕێکەوتی وتن ١٩٧٣/٩/١١

مەقامی (عەجەم )

کەو یـــــارێ کەو یـــــار، خــــاس کەویـــــارێکی

دەم تەڕو لێــۆ ئــاڵ زولــف لــول عەجەب یــارێکی

وەنەوشـــــــەم دەچنــــــی مەڵــــــۆ بە مەڵــــــۆ

خەڵکـان پێـی شـاد بـوون ئەی وەی ئەمنـیش ڕەنـجەڕۆ

خەڵکان پێی شـاد بوون، ئەی هـاوار ئەمنیش ڕەنجەڕۆ

کەویـــــــــارێ کەو یـــــــــار ئەردەڵانیــــــــیە

ســـــەوزەی قەد باریـــک شـــل و مـــل موکریـــانییە

ئەو قەد بـــــاریکە دەیناســــــم خـــــۆ بۆکـــــانیە

وەنەوشـــــــەم دەچنـــــی پەنـــــجەم دا لە گـــــوڵ

شـــەوگارم شـــەق کـــرد ئەی وەی نەگەیـــم بە دڵ

شـــەوگارم شـــەق کـــردمن چـــی بـــکەم نەگەیـــم بە دڵ

کەو یـــــارەی کەویـــــار کەویـــــارەی خـــــۆمی

بەڕەزای شـــــاخان وەڵا دەی کەنێـــــرەی چـــــۆمی

بەڕەزای شـــاخان زۆر جـــوانی کەنێـــرەی چـــۆمی

# کەویار


♩ = 120
music
1. 2.
song
که و یا ری
که و یا ر خا س که و ی ا ر ێ کی
ده م تەرو لێ و ئا ڵ زو ل ف لول
عه جه ب ی ا ا ا ی ا ڕ ێ کی
ده م تەرو لێ و
ئا ڵ زو ل ف لول عه جه ب ی ا ا ا ی ا ڕ ێ کی

## گۆرانی کوزەڵە و بەنۆڵە

لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣ کاتێ شوێنەکەمان لە قوتابیان بوو چەند کەسێک سەردانیان ئەکردین یەکێک لەوانە {عەبدوڵای ئەوڕەحمانی خەلیفە} بوو یەک دوو گۆرانی بۆ وتین کە یەکەمیان بەم شیعرە دەستی پی ئەکرد (کوزەڵەو بە نۆڵە ترشۆکەی شاخی/ یارێکم هەیە لێم بووە یاخی/ لەوبەر بەلۆعە حاجەت ئەشۆرێ/ دایکی لێی داوە لە من ئەتۆرێ) وە دووهەمیان لە سەر ئاوازێکی عەرەبی عێراقی بوو کە چەندین گۆرانی بێژ وتویانەتەوە یەک لەوانە (یاس خضر) کە بەم شێوەیە (یا عزیز الروح یا بعد عینی . شنهو ذنبی ویاک ما تحاچینی ) کە بە کوردی ئەم شیعرە فۆلکلۆرییەی لەسەر دانراوە:

یا عەبابەیلێ ماڵ بە بەرزەوە/ یارم نەکوژی بە دەم لە رزەوە/ یا عەبابەیلێ بەرت هەر بەردە/ بمکەی بەڕەفیق ئەو کراس زەردە

**لێرەدا بۆ پاراستنی ئەو ئاوازانە نۆتەو هۆنراوەکەی ئەنوسمەوە کە هۆنراوەو ئاوازی فۆلکلۆرە:**

کوزەڵەو بە نۆڵە ترشۆکەی شاخی

یارێکم هەیە لێم بووە یاخی

لەبەر بەلۆعە حاجەت ئەشۆرێ

دایکی لێی داوە لە من ئەتۆرێ

کوزەڵەو بە نۆڵە

ئاوازو هۆنراوەی فۆلکلۆر

♩ = 100

کو زە ڵە و ن ۆ ڵە تر شۆ کەی ش ا خ ی یا رێ کم ه ه یە لێم ب وە ی ــــی ا خی

5 لەو بەر بە لو و عە حا جە ت ئە شۆ رێ

8 دای کی لێی د ا وە لە من ئە ت ۆ ــــۆ رێ

**گۆرانی (یا عەبابەیلێ )**

**هۆنراوەی** فۆلکلۆر

**ئاواز** :عەرەبی (عێراقی )

یـــــا عەبـــــابەیلێ مـــــاڵ بە بەرزەوە      یــــــا عەبـــــــابەیلێ  بەرت هەر بەردە

یـــــــارم نەکـــــــوژی بەدەم لەرزەوە      بـــم کەی بەرەفیـــق ئەو کـــراس زەردە

یا عە بابەیلێ

هۆنراوە ی فۆلکلۆر
ئاوازی :(عەرەبی )عیراقی
مەقامی (نەوشار )

♩ = 100

**گۆرانی هەی بێنن بێنن بەدەنگی سەید تەهای شێخ حەمە ئەمین**

سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ کاتێ شوێنەکەمان گواستەوە بۆ بارەگای یەکیتی لاوان، لەوێ خەریکی پرۆڤە کردن بووین، ئەو کەسانەی کە لەو بارەگایە بەرپرسیار بوون بریتی بوون لە (فەرەج حەمە ساڵح و قادر سۆفی سەعید) وە چەند کەسێکی تر. بیناکە خانویەکی ڕۆژهەلاتی کۆنکرێت بوو ژووریکیان دابوو پێمان، ئێمەش بۆ خۆمان تەمرینمان ئەکرد، جار جاریش (سەید تەهای شێخ حەمە ئەمین) ئەهات ڕۆژێکیان هات و چەند گۆرانییەکی کۆنی بۆ وتین وەک (هەی بێنن بینن گالیسکە بێنن، ئەو کچە منالە دلّی مەشکێنن) کە لە سەر ئاوازی شیرین هەلامە دەیگوتەوە کە بیرم نەماوە، بەلاّم بۆ ئەرشیف کردنی گۆرانییەکە بە نۆتە ئەنوسمەوە لەگەڵ هۆنراوەکەی:

هەی بێـــنن بێـــنن گالیســـــکە بێـــنن

ئەو کـــــچە منـــــداڵە دڵـــــی مەشـــــکێنن

شــــەوان شــــەو نــــاڵەو ڕۆژان ڕۆڕۆمە

دایـــــم پەژارەی دووریەکەی تــــــۆمە )

**تێبینی:**

**ئەم دێڕەی کۆتایی خۆم بۆم داناوە کە ئەویش فۆلکلۆرە، بۆ تەواو کردنی میلۆدییەکە**

هەی بێنن بێنن

♩ = 100 song

ئاوازو هۆنراوەی فۆلکلۆر

کی مەش ی ل د و لە ها دا من چی ك ئەو نن ی بی کە س لی گا نن ی بی ن ن ی ب هەی

8
ی کە ە ی دور ی ر ە ی ا ژا پە م ی دا مە و رۆ رۆ ن ژا رۆ لەو ا نا شەو ن وا شە نن ی

16
نن ی بی کە س لی گا نن ی بی ن ن ی ب هەی مە تۆ

21
نن ی کی مەش ی ل د و لە ها دا من چی ك ئەو

ئومێدی نوری حەمەی نانەوا ئۆكۆردیۆنێكی هێنابوو لای مامۆستا ولیم یۆحەنا ساڵی ١٩٧٤ بوو خۆمان ئامادەكرد بۆ ئەوەی لە ڕۆژی ١٩٧٤/٢/١٨ ئاهەنگێك ساز بكەین بۆ یادی دامەزراندنی یەكێتی قوتابیانی كوردستان، بۆ ئەم مەبەستەش دەستمان كرد بە پرۆڤە كردن وە چەند كەسێكی نوێ هاتن بەشدار بوون لە گەڵمان چ وەك موزیك ژەن چ گۆرانی بێژ چ وەك كۆرس، لەوانە {كاوەی قادری خەیات} كە هات بۆ ئامێری شمشاڵ، وە{پەیمان حسین} بۆ جاری دوهەم بەشداری لەگەڵ كردین، هەروەها وەك گۆرانی بێژ (حەمە سەعید) و {كەمال محەمەد ئەمین} و {عەلی سەعید جەواهیر} و كۆرسیش وەك:{ كامەران ئەحمەد، ئەسكەندەر حەمە فەرەج، ڕزگار عبداللە، سۆران حسین، بەختیار محەمەد مەحمود} هەروەها چەند ئەندامێكی ساڵی ١٩٧٣ بەشدارنەبوون وەك فوئاد محەمەد مەحمود كە قوتابی ئامادەیی پیشەسازی سلێمانی بوو، وە عەزیز بابان قوتابی كشتوكاڵی بەكرەجۆ بوو هەروەها سەركۆ ئەحمەد لە سلێمانی دەیخوێند، وەك یادەوەرییەك هەندێ ئامێری تازەمان هێنابوو لە چالاكی قوتابخانەكانی سلێمانی، ئومێدی نوری حەمەی نانەوا ئۆكۆردیۆنێكی هێنابوو لای مامۆستا ولیم یۆحنا (چارەكە تۆنی ) تێدا بوو كە بە شێوەیەك بۆی دروست ئەكرا پارچەیەكی بچوك (مێو ) كە وەك مۆم وابوو دەخرایە ئەو دەنگەی بتویستایە چارەكە دەنگی پێدروست بكەیت بەو شێوە دەكرا وە ئامێری (تەپڵ )كەمان تەقی بوو بە ڕۆژێك كەسێك بۆی تێ گرتینەوە بە ناوی (عەلی گەوهەر) كە بە درێژی لە لاپەرە ٨٩ ی كتێبی (هەڵەبجەو موزیك بیرەوەری و یاد) باسم كردوە وە ئەو كەسانەی بەشداربوون لەم چالاكییە بریتی بوون لەم كەسانەی خوارەوە :

| ژ | ناوی بەشدار بوو | ناوی ئامێر | جۆری بەشدار بوون |
|---|---|---|---|
| ١ | ئازاد ساڵح | ئامێری كەمان | موزیك ژەن |
| ٢ | مستەفا كەمال | ئامێری كەمان | موزیك ژەن |
| ٣ | ئومێد نوری | ئۆكۆردیۆن | موزیك ژەن |
| ٤ | كاوە قادر | شمشاڵ | موزیك ژەن |
| ٥ | ئازاد مەحمود | دەف زنجار | موزیك +گۆرانی |
| ٦ | پەیمان حسەین | ئیقاع | موزیك ژەن |
| ٧ | كەمال محەمەد ئەمین | | گۆرانی بێژ |
| ٨ | عەلی سەعید جەواهیر | | گۆرانی بێژ |
| ٩ | حەمە سەعید | | گۆرانی بێژ |
| ١٠ | سیروان عەلی ڕەزا | | گۆرانی بێژ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١١ | ڕزگار عبدالله | | کۆرس |
| ١٢ | سۆران حسين | | کۆرس |
| ١٣ | بەختيار محەمەد مەحمود | | کۆرس |
| ١٤ | ئەسکەندەر حەمە فەرەج | | کۆرس |
| ١٥ | مەحمود کەشکۆڵ (شێخ عەلی) | | پێشکەشکار |
| ١٦ | م.حەمە سەعيد | | پێشکەشکار |




١٨/ ٢/ ١٩٧٤ شوێن – هەڵەبجە

**لەڕاستەوە :** پەیمان حسێن ، ئازاد مەحمود سەراج ، کاوە قادر ، ئومێد نوری ، مستەفا کەمال ، من (ئازاد صالح) لەپاڵ مستەفادا بووم بەلام دەرنەچووم.

**گۆرانی بێژەکان :** کەمال محەمەد ئەمین، عەلی سەعید، سیروان عەلی، حەمە سەعيد

**کۆرسەکان :** ڕزگار عەبدولا، سۆران حسێن، بەختيار محەمەد مەحمود، ئەسکەندەر حەمە فەرەج، کامەران ئەحمەد

## بەرهەمەکانی ئاهەنگی ساڵی ١٩٧٤ و نۆتەکانیان

| ژ | ناوی گۆرانی بێژ | ناوی گۆرانی | هۆنراوە | ئاواز/ ئامادە کردن |
|---|---|---|---|---|
| ١ | کۆرس | سروود/پێشڕەو | ئومێد نوری | |
| ٢ | ئازاد مەحمود | خاڵەی ڕێبوار | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر |
| | عەلی سەعید | | | |
| | سیروان کاکەیی | | | |
| ٣ | پارچە موزیک | شنروێ | | مستەفا کەمال |
| ٤ | عومەر خەزان | مەقام وگۆرانی کەتانە | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر |
| ٥ | کۆرس | هیوای ژیان | لەتیف شیخ عارف | ئازاد ساڵح |
| ٦ | ئاواز جەمال/ڤیان محەمەد | هەی گەرمیانی | فۆلکلۆر | فۆلکلۆر /فوئاد ئەحمەد |
| ٧ | کۆرس | دەمەو بەیانە | ئەحمەد دەنگ گەورە | |

## یەکەم بەرهەمی ساڵی ١٩٧٤ (پێشڕەوی گەل )

پێشڕەوی گەل

ئاوازو هۆنراوەی :ئومێد نوری
مەقامی :عەجەم (فا مایجۆر)
ساڵی 1974

♩ = 110

گەلە ئەم قەت ێ و نە نا سوپا ی ن وا تی پش بە لە گە لەم وە لا قو هەڵ گەلە وی رە ش پێ تی پار

5
کەران گیر دا ی ژ د لە ە ر وە گا ن جە کەرە شەڕ شان کۆ تێ تو با خە بۆ ە و رە پێش- وە رە پێش

9
مان تی پار نە ما تی پار نە ما تی پار لای ئا ژێر لە ستان دو کور کی خا مو هە خۆ زا نو قی نە خا لە هەر

13
گەلە وی رە ش پێ تی پار مان تی پار نە ما تی پار مان تی پار نە ما تی پار

16
گەلە ئەم قەت ێ و نە نا سوپا ی ن وا تی پش بە لە گە لەم وە لا قو هەڵ

پارتی پێشڕەوی گەلە        هەڵقوڵاوە لەم گەلە
بەپشتیوانی سوپا        نانەوێ قەت ئەم گەلە
پێشڕەوە پێشڕەوە        بۆ خەبات و تێکۆشان
شەڕ کەرە جەنگاوەرە        لە دژی داگیرکەران
هەر لەخانەقاین و زاخۆ هەموو خاکی کوردستان
لە ژێر ئاڵای پارتیمانە پارتیمانە پارتیمان
پارتیمانە پارتیمان
پارتی پێشڕەوی گەلە
هەڵقوڵاوە لەم گەلە
بە پشتیوانی سوپا نانەوێ قەت ئەم گەلە

## دووهەم بەرهەم ساڵی ١٩٧٤ (خاڵۆی ڕێبوار)

خاڵۆی ڕێبوار

ئاوازو هۆنراوەی :فۆلکلۆر
ووتنی :ئازاد+عەلی +سیروان
ساڵی 1974

♩=90

ئەی خا لۆ ی ڕێ ب وار خا لە ڕێ گا نا زا نم بم خە سە ڕێ گا خا لە قە زات لە گی
ا ن م ئە ی خا لەی ڕێ ب وار ڕ ێ گا نا زا ا
نم ب م خە رە سە ر ێ خا لە ق ە زا ت لە گی انم

ئەی خاڵۆی ڕێبوار خاڵە ڕێگا نازانم بم خە سەرڕێگا خاڵە قەزات لە گیانم
ئەی خاڵەی ڕێبوار ڕێگا نازانم بم خەرە سەر ڕێ خاڵە قەزات لە گیانم

## بەرهەمی سێهەم (پارچە مۆسیقای شنرۆێ)

**تێبینی: پارچە مۆسیقای (شنرۆێ ) لە دانانی مستەفا کەمال خەفاف هیچم لە بیر نەماوە بۆیە نەمتوانی نۆتەکەی بنوسمەوە.**

## بەرهەمی چوارەم گۆرانی (کەتانە )

**شیعر و ئاوازی :** فۆلکلۆر

ئەگەر نـایزانی گیـانەکەم مـن بـۆ تـۆ چـۆنم بــۆکزەی کەبــاب بــاوانم دێ لە دەروونــم

کەتانە عەمرم کەتانە

دەم کۆڵ دەم بێنە ئەی هاوار دەم بچکۆلانە

بێنیە ماچت کەم باوانم توو ئەو قورئانە خاڵ دانە دانە

هەرچـی ئەبیـنم گیـانەکەم تـۆی تیـا ئەنـوێنێ ســەر لە نـوێ دڵەکەم بـاوانم دا ئەخـورپێنێ

کەتانە عەمرم کەتانە دەم کۆڵ دەم بێنە ئەی هاوار دەم بچکۆلانە

بێنیە ماچت کەم باوانم توو ئەو قورئانە خاڵ دانە دانە

**تێبینی :بۆ نوسینەوەی نۆتەی ئەم گۆرانییە سوودم لە گوتنی ناسری ڕەزازی وەرگرتووە.**

## کەتان کەتانە

ئاواز و هۆنراوەی فۆلکلۆر


















## یەکەمین ئاوازی من لەساڵی ١٩٧٤

## پێنجەم : ( گۆرانی ساڵی ١٩٧٤ بە ناوی (ئەو هیوای کە پێی ژیام)

ئەوە هیوای کە پێی ژیام

هۆنراوەی:لە تیف شێخ عارف
ئاوازی: ئازاد ساڵح
ساڵی 1974

Moderato ♩ = 90

ئەو هی وای کە پێ ی ژ یام شە پۆ لی مەرگ را پ ێ چی کرد ئەو هی وای کە پێ ی ژ یام

شە پۆ لی مەرگ را پ ێ چی کرد هە ر چ ی ە ە س ـــو ت خ ۆ ش ی ژ ی ـــا ن ن ل ە نا و د ڵ م

ب و ب ە ز ر ـــــ ی ان ئەو هی وای کە پێ ی ژ یام شە پۆ لی مەرگ را پ ێ چی کرد

ئەو هی وای کە پێ ی ژ یام شە پۆ لی مەرگ را پ ێ چی کرد

ئەو هیوای کە پێ ی ژیام شەپۆلی مەرگ ڕاپێچی کرد )٢

هەرچی هەست و خۆشی ژیان لە ناو دڵم بوو بە زریان )٢

ئەو هیوای کە پێی ژیام شەپۆلی مەرگ ڕاپێچی کرد )٢

تێبینی :ئەمە یەکەمین ئاوازی منە لە بواری مۆزیک کە ساڵی 1974 دام ناوە کە سوودم لە شمشاڵەکەی مینەی لولک ژەن وەرگرتوە لەم ئاوازەدا .

وە تەنها یەکەمین دێڕی هۆنراوەکەم لە بیر ماوە و بڕگەی دووهەمی خۆم دامناوە بۆ گونجاندنی بۆ تەواو کردنی ئاوازەکە

## گۆرانی شه شەم ( ئەی کوێستانی خۆشە گەرمێن )

**هۆنراوە و ئاوازی :** فۆلکلۆر

**وتنی** : ئاواز جەمال و ڤیان محەمەد

مەقامی بەیات لەسەر دەنگی (می )

ئەی گەرمێنی

ئاوازو هۆنراوەی فۆلکلۆر

♩=100
music

song

نی مێ گەر ئەی

خۆ شە کوێ س تا ن قە د قە د ل یی ئ ا ڵا ن د وە پش ت وێن

لەو پش تۆێ نەی ج وا ن ت ر ب ێ د ە ڕۆ م ب ۆی د ێ م ن ن م لە گە ر مێن

ئەی کوێستانی خۆشە گەرمێن قەد قەد لێ ی ئاڵاندوە پشتوێن )٢

لە و پشتوێنەی جوانتر بێ دەڕۆم بۆی دێنم لەگەرمێن )٢

## ئاوازی حەوتەم (دەمەو بەیانە)

**هۆنراوەی :** فەتاح کاوە

**ئاوازی :** ئەحمەد دەنگ گەورە

**وتنی کۆرس**

**تێبینی :**ئەم هۆنراوە و ئاوازە ئومێد نوری هێنای کە کاتی خۆی لە سلێمانی لەگەڵ تیپێکدا پرۆڤەی کردبوو وە لەبەری کردبوو، ئەم هۆنراوەیە بە تەواوی لەبیرم نەماوە، بەڵام کاتی خۆی دوای نمایش کردنی ئەم ئۆپەریتە، لە کتێبخانەی گشتی هەڵەبجە ڕۆژێکی هاوین بوو خەریکی خوێندنەوەی گۆڤاری (ڕزگاری )بووم کە ساڵانی ١٩٦٨ مەکتەبی سیاسی پارتی واتە باڵی جەلالی دەری ئەکرد، من ئەو هۆنراوەم هەموو خوێندەوە، بۆم دەرکەوت هۆنراوەکە خاوەنی (فەتاح کاوە ) نوسرابوو لەوەو پێش ئومێد نوری باسی نەکردبوو، ئەم هۆنراوەیە لە شێوەی ئۆپەریتە، بەڵام ئێمە لە ساڵی ١٩٧٤ وەک گۆرانی نمایشمان کرد بەدەنگی کۆرس، ئەمەش ئەو هۆنراوە و ئاوازەیە کە هێندەی لەبیرم بێت نوسیومەتەوە چ بە هۆنراوە چ وەک ئاواز بەنۆتەی مۆزیک.

**ئەمەش دەقی ئەو هۆنراوەیە کە لەبیرم ماوە:**

دەمەو بەیـــــانە ئامـــــادەی جەنگـــــین     لە پەنـــا تـــاوێر وریـــاو بـــێ دەنگـــین

دوو دوو لە ســــەنگەر دابەشـــین لەڕێ     خـــۆم و هەڤـــاڵم وایـــن لەپێشـــی دێ

دەســـت بە گـــۆزەوە پـــۆلێ کـــچ و ژن     بە ئـــێمە ئاشـــناو بە دوژمـــن دژن

**خوشکی پێشمەرگە، ئازاو بەجەرگن / (کوڕانی ئازا ، لە مەرگ ناترسن) ئەم دێڕەی کە لە کەوانەکەدایە خۆم داماوە بۆ تەواو کردنی گۆرانییەکە چونکە لە بیرم نەماوە.**

